زنجیرە بابەتی شکۆمەندیی بانگەواز

# عەبدولڕەحمان سەمیت

## ئەو بانگخوازەی ١١ ملیۆن کەس لەسەر دەستی موسوڵمان بوو
## (ناسراو بە خزمەتکاری هەژارانی ئەفریقیا)



لەبڵاوکراوەکانی ڕاگەیاندنی ئەنجومەنی ئیمام و بانگخوازانی کورد لە بریتانیا



**بسم الله الرحمن الرحيم**

(وتعاونوا على البر و التقوى و لا تعاونوا على الاثم والعدوان )

پێشەکی

ئەگەر مرۆڤەکان کەمێک بیر بکەنەوە بۆیان ڕوون دەبێتەوە کە تەنها بۆ خەوو خواردن وخواردنەوە نەهاتوونەتە ئەم ژینە!! بەڵکو ئەرکی ئاوەدانکردنەوەی ئەم زەویەیان پێدراوە (إعمار الأرض ) ئەوزەمینەی کە مرۆڤەکان لێ ی درووست بوون و ئەرکی ئاوەدانکردنەوەشی هەربەخۆیان سپێردراوە !! وەک ئەو منداڵەی کە لەڕەحمی دایکیدا پەروەردە دەبێت ، ڕێزوو حورمەتی ئەودایکەی لە ئەستۆیەو لەگەڵبوونیشی ئاسوودە ی دەکات بەهەمان شێوە کردگاری مەزن کە مرۆڤەکانی لەوخاکە درووست کردووە بۆئەوەیە بەئەمەک بن بەرامبەری و بەباشترین شێوە ئاوەدانی بکەنەوە و بەبێ ئەویش ئاسوودە نابن. ئەوەتا لەهەرشوێنێک بن ناحەوێنەوە تا نەگە ڕێنەوە سەرزەوی !! ئارامگای دڵەکان !! چەند بەرز ببیتەوە بۆ ئاسمان ئاسوودە نابیت تا نەگەڕێیتەوە سەر زەوی . بۆیە لەم سۆنگەیەوە مرۆڤەکان دەبنە دوو بەش : ئاوەدان کەرەوە یان تێکدەر و ڕووخێنەر !! چاکە ئاوەدانکەرەوەیەو بەخراپەیش تێک دەچێت و دەڕووخێت .

جابزانین ئێمە لەکامیانین ؟!

وەبۆچی ئێمەی مرۆڤ کراوین بە جێنشین وئاوەدانکەرەوە نەک جنۆکە!! لەکاتێکدا ئەوانن لەئیمە زیاترن وبەهێزتریشن و لەپێش ئێمە یشەوە درووست کراون ! لەئاگریش درووست بوون و ئێمەش لەخۆڵ !! بەڵام خۆڵ کرایە جێنشین چونکە ئارامی و ئاوەدانی پێوەیە !! نەک ئاگر کە ترس و بیم و تۆقاندنی پێوەیە !! بۆیە خۆڵ شیاوتر بوو بۆ ئەرکی جێنشینی کە مرۆڤەکانن !! وە ئەمە گەورەترین ڕێزە خوا ی گەورە لەمرۆڤەکانی ناوە و بەوهۆیەشەوە گەورەترین ڕوداوی مێژوویی لێکەوتەوە ئەویش کڕنووشی فریشتە بوو بۆ مرۆڤ ! کەواتە تاواننێکی گەورەیە ئەوڕێزە گەورەیە لەدەست بدرێت و خۆ خەریک بکرێت بەکارێک نزم بوونەوەو سەرشۆڕی پێوەبێت ! ئەویش خۆویستی و لاموبالاتی و کەنارگیری یە!! چونکە خۆ دوورگرتن لە کێشەو پێداویستی خەڵکی ، مرۆڤەکان دەکاتە نامۆ بە گەل و میللەت !! چونکە کەسێک بێباک بێت لەکاروباری باوەڕداران ئەوە لەڕیزی ئەوان هەژمار ناکرێت و هەمیشە شوێنکەوتەو لاواز دەبێت وەک دەستێکی ئیفلیج وادەبێت بوونی بێسوودەو نەهێشتنیشی ئازاروو مە ینەتییە . بەڵام ئەوانەی کە گوێ دەدەن هەمیشە لەدڵی گەلەکەیاندا گەورەن چونکە خۆنەویستی مەدالیای شەرەفە بۆ باوەڕداران و بەرپرسیارێتیە و پلەوپایەیان بەرزدەکاتەوە لە دونیاو لەپاشەڕۆژیشدا . چونکە ئەو هەست کردن بە بەرپرسیاریەتیەش تاوانباران دەکاتە کون و بازنەی لە ڕێ لادان و خیانەت و لاموبالاتی بنەبڕدەکات! وە بەرپرسیاریتی لەئیسلامدا سنووری نیە و گۆڕەپانەکەی هەموو سەر زەمینە !! هاوەڵە بەڕیزەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم ) و شوێن کەوتەکانیان باشترین نموونەی



هەڵگرانی ئەو بەرپرسیاریەتیەن و ئەوان فریشتە نەبوون و مرۆڤ بوون وەکوو ئێمە!! برسی و تینوو دەبوون و بێخەوی کاری تێ دەکردن !! بەڵام تەنها ئەوە بوو ئەوان لێبڕاوبوون!!

بەرپرسیاریەتی ئەوە نییە کە پارەت زۆرتر بێت!! یان سەیارەی جوان وماڵی جوان و پاسەوانی زۆرت هەبێت!! بەڵکو بەرپرسیارییەتی لێپرسینەوەیە بەرامبەر هەتیوێک ، بێوەژنێک ، پیرەمێردێک ، نەخۆشێک ، قوتابییەک ، هەژارێک ، منداڵێک ، دارێک ، ئاژەڵێک ، هتد .

دکتۆر سەمیت هەستی بەو بەرپرسیاریەتیە دەکرد کە بانگخوازان بۆ خۆشگوزەرانی لێقەوماوان و هەژاران دەبێت شەونخونی و زەحمەتی زۆر بکێشن لەو پێناوەداو تەنها حەوانەوەی ئەوان لەبەهەشتی خوای گەورە دەبێت نەک لە دونیادا !! چونکە تەنها بانگخوازانن کەدەبێت بەر بە شەپۆلی گوناه و تاوانەکان بگرن و مرۆڤەکان ڕزگار بکەن لەبەندایەتی بەندە بۆ بەندایەتی خوای گەورە و تاکە کەشتییەکیش کە هەرگیز نووقم نابێت کەشتی بانگەوازەو مرۆڤەکان ڕزگاردەکات لە لێواری غەرق بوون .

بۆیە بانگخواز دەبێت خەمی ئەو ئوممەتە لەئەستۆ بگرێت بەبێ جیاوازی ڕەنگ و نەتەوە و ڕەگەز و بەهۆی ئەو بەرپرسیارییەتەشەوە کەلەئەستۆی دەگرن لەوانەیە زوو پیر ببن!! یان زوو بمرن!! بەڵام تەمەنەکەیان تەمەنی شکۆمەندییەو مردنەکەشیان دەبێتە ژیانی نەبڕاوە بۆ خۆیان و بۆ ئەوانەش کە لەدوای خۆیان جێیان دێڵن .

بۆیە دکتۆر سەمیت سوارچاک و پسپۆڕی ئەم بوارەبوو وەک ماسی چۆن بەبێ ئاو ناژی ئەویش وابوو بەبێ ئەو بانگەوازە هەستی بەتام و چێژی ژیان نەدەکرد ، خۆشی و کامەرانی ئەو ، ماندوو بوون بوو بۆ گەیاندنی ئەو ئیسلامە بەو شەوق وجوانییەی کەداواکراوە لێمان و دڵسۆزی و هەماهەنگی و شیرین رەفتاریی باوەڕداری ڕاستەقینەی بەجیهان ناساند هەروەکوو پێغەمبەری خۆشەویستمان لەبارەی باوەردارانەوە دەفەرموێت : ( والذي نفس محمد بيده إن مثل المؤمن

لکمثل النحلة أكلت طيبا ووضعت طيبا ووقعت فلم تكسر ولم تفسد ) شێخ ئەحمەد شاکیروو ئەلبانی تەسحیحیان کردووە.
واتە سوێند بێت بەوکەسەی کە گیانی موحەممەدی بەدەستە نموونەی باوەڕدار وەکوو هەنگێک وایە لەپاک دەخوات و پاکیش دادەنێتەوە و بەسەر هەر چڵێکیشەوە بوەستێتەوە نایشکێنێت و خەساری ناکات !!
منیش بەپێویستم زانی کەمێک لە ژیاننامەی ئەم کەڵە پیاوە تەرجەمە بکەم و بیخەمە بەردەستی خوێنەری کورد بە گشتی و بانگخوازە بەڕێزەکان بەتایبەتی بەوهیوایەی هەموولایەک سوودی لێببینین .
والسلام علیکم ورحمة الله وبرکاته

حمەڕەشید پێنجوێنی - بریتانیا – پرادفۆرد 2013/04/14



# کورتەیەک لەژیانی دکتۆر عەبدولڕەحمان ئەلسەمیت

عەبدولڕەحمان کوری حەمودی سەمیت ، لەدایک بووی ساڵی 1947 لە وولاتی کوێت و دامەزرێنەری{ کۆمەڵەی هانای ڕاستەوخۆ ] و دامەزرێنەر و سەرۆکی دەستەی موسوڵمانانی ئەفریقیا لەڕابردوودا و سەرۆکی مەجلیسی توێژینەوە و خوێندنی ئیسلامی بووە.

لەسەردەستیدا زیاتر لە 11 ملیۆن کەس لەئەفریقیادا باوەڕی هێناوە پاش ئەوەی کە 29 ساڵ بەبەدەوامی بانگەوازی ئیسلامی بڵاوکردۆتەوە لە کیشوەری ئەفریقیادا کەڕۆژانە دەکاتە موسوڵمان بوونی 972 کەس بەشیوەیەکی گشتی .

پێش ئەوەی ببێتە چالاکوانێکی گۆرەپانی خێرخوازی ، پزیشکی پسپۆربووە لە نەخۆشییەکانی ناوەوەی مرۆڤ و جیهازی هەزمی .

## زانست و کار کردن

عەبدولڕحمانی سەمیت خوێندنی سەرەتایی و دواناوەندی لە قوتابخانەکەنی کوێت تەواو کردووە و پاشان لە زانکۆی بەغداد بەکالۆریۆسی لە بواری پزیشکی و نەشتەرگەریدا بەدەست هێناوەو پاشان ساڵی 1974 دبلۆمی لە نەخۆشی یەکانی ناوچە گەرمەکان لە زانکۆی لیڤەرپوول لەبریتانیا وەرگرتووەو دواتریش خوێندنی باڵای لەزانکۆی ماکجل (Mc Gill ) لە کەنەدا تەواو کردووە.

دواتر دامەزراوە وەکو پزیشکی پسپۆر لە نەخۆشخانەی شاژن لە لەندەن بۆ ماوەی یەک ساڵ لە ساڵی 1979 تا 1980. پاشان دوای بەدەست هێنانی شارەزایی و مەهارەتێکی زۆر گەڕایەوە بۆ کوێت و وەکو دکتۆرێکی پسپۆر کاری

دەکرد لە نەخۆشخانەی سەباح و  چەندین توێژینەوەی زانستی و پزیشکی لە بوارەکانی کۆلۆن و لێکۆڵینەوە شێرپەنجەییەکان بڵاوکرۆتەوە.

پاشان بوویە ئەمینداری گشتی کۆمەڵەی موسوڵمانانی ئەفریقیا  و  بەردەوام بوو لەسەر کارەکەی پاش ئەوەی کەناوەکەی  گۆڕا بۆ  کۆمەڵگای هاوکاری ڕاستەوخۆ لە ساڵی 1999 .هەتا ساڵی 2008  و ئێستا بەڕێوەبەری  مەرکەزی توێژینەوەی کاری خێرخوازییە لە کوێت.

## خۆپاراستنی لە حەرام

سەمیت زۆرمەبەستی بوو کە خۆی لەحەرام بپارێزێت هەربۆیە 5 ساڵ لەکەنەداو 3 ساڵ لەبریتانیا نەچۆتە هیچ چێشتخانەیەک هیچ خواردنێکی نەخواردووە نەوەکو حەرامی تێدابێت، بەتایبەت هیچ جۆرە پەنیرێکی نەدەخوارد چونکە دەترسا لەوەی پێکهاتەکانی بەراز یان هەر ئاژەڵێکی تری تیابێت کە بەڕێگای شەریعەتی ئیسلام سەرنەبڕرابێت .

## سەرەتای منداڵی

سەمیت هەرلەمنداڵیەوە شەیدای خوێندنەوە بووە ، بۆیە زۆر جار باوکی توورە دەبوو لێی کەچیتر لەگەڵ خۆی نایبات بۆ بازاڕ !! ئەویش بەهۆی ئەوەی هەرکات پەڕەی ڕۆژنامەیەک یان گۆڤاریکی لەسەر زەوی بدیتبایە خێرا پەلاماری دەداو دەیخوێندەوە هەربەدەم ڕێگاوە !! بۆیە زۆر جار بەرخەڵک دەکەوت لەبەر بێ ئاگایی و  سەرقاڵی بەخوێندنەوەیانەوە.  بەردەوام هاتووچۆی کتێبخانەی گشتی دەکرد لە کوێت بۆ خوێندنەوە کە ئەو پەڕتووک و زانیارییە زۆرانەی کە دەستی دەکەوت تیایاندا زیاتر چاوی کردبوویەوە کەئەمە بۆ هاوەڵەکانی تری وەکوو پێویست بەرجەستە نەدەبوو .



خوێندنەوەکانی گشتگیر بوو  ، هەموو شتێکی دەخوێندەوە  هەر لە زانستە شەرعییەکان ، ئایینەکانی تر ، سیاسەت و ئابووری و زۆر بابەتی تریش . ڕەوشتی وابوو هەرپەڕتووکێکی بەدەستەوەبوایەت نەدەحەوایەوە هەتا هەمووی تەواو نەکردایە . بۆیە هەرکات بچوایە بۆ کتێبخانەیەکی گشتی لەپێش دەوام دەچوو بۆ ئەوەی یەکەم کەس بێت و تا قاپییەکانیشیان دانەخستایە نەدەهاتە دەرەوە . بۆیە زۆربەی ئەو پارانەی بهاتایەتە دەستی پەڕتووکی پێ دەکڕی بەتایبەت ئەوانەی کەلە میسرەوە دەیان هێنان .

لەگەڵ ئەوانەشدا  کەسێکی دیندار بووەو  هەر لەتەمەنی 6 ساڵی یەوە نوێژی کردووە ، زۆر هۆگری نوێژەکانی بووەو بەتایبەتی نوێژی بەیانی چێژی زۆری لێ دەکرد . خەڵکی گەڕەک ناویان نابوو خۆ بەخش .

## یارمەتی دانی هەژاران

هەر لەو کاتەی کە قوتابی دواناوەندی بوو دڵی پڕجۆش بوو بۆ خزمەتی هەژار و نەدارەکان و کاتێک ڕۆژانە کرێکارە هەژارەکانی دەبینی کە ماوەیەکی زۆر دەوەستن لەبەرخۆر و چاوەڕوانیی پاس دەکەن بۆ گەڕانەوەیان بۆ ماڵەوە  هەستا بە کۆکردنەوەی بڕێ پارە بە هاوکاری هاورێکانی کە یەکی 10 دیناری کوەیتی لێوەرگرتبوون و ئۆتۆمبیلێکی کۆنیان  پێ کڕی و ڕۆژانە ئەوکرێکارە هەژارانەی دەبردەوە بۆماڵەوە بەبێ بەرانبەر تەنها لەبەر خوای گەورە .

هەروەها کاتێک لە زانکۆ بوو زۆرترین خەرجییەکانی تەرخان دەکرد بۆکڕینی نامیلکەی ئیسلامی ودابەشی دەکرد بەسەر مزگەوتەکاندا ، کاتێک مانگانە 42 دیناری کوێتی وەردەگرت وەکوو یارمەتی بۆ خوێندکاران ڕۆژانە لە یەک ژەم زیاتری نەدەخوارد و قەرەوێڵەی نەدەکڕی بۆ خەوتن لەسەری !! ئەگەرچی بە تەنها 2 دینار دەیتوانی  بیکڕێت بەڵکوو لەسەر زەوی دەخەوت چونکە پێی وابوو ئەمە  جۆریک لە خۆش گوزەرانییە .

لەو کاتەی کە سەرقاڵی خویندنی باڵا بوو لە ڕۆژئاوا ڕۆژانە دۆلارێکی کۆدەکردەوە لە قوتابی یە موسوڵمانەکان و بەو پارەیەش نامیلکەی ئیسلامی پێ چاپ دەکرد و دەینارد بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ئەفریقیا و چەندین کاری خێری تری پێ دەکرد .

هەمیشە سوور بوو لەسەر یارمەتی هەژاران و بەردەوام لایەنگری نەدارو بێدەسەڵاتەکان بوو ، کاتێک هەستی کرد برسییەتیی هەڕەشەیەکی گەورەیە لەسەر باوەڕدارانی ئەفریقیا و بەئاگابوونی لە هەوڵی بەگاورکردنی خەڵکانی ئەفریقا ، خۆبەخشانە وازی هێنا لە کارە پزیشکییەکەی و دەستی کرد بە پێکهێنانی مەشروعێکی خێرخوازی کە ببێتە قەڵغانێک بۆ ڕەواندنەوەی برسێتی هەژاران و تیمێکی دڵسۆزی خۆبەخشی بۆ خۆی درووست کرد بەمەبەستی چارەسەری بێبەرانبەری نەخۆشە هەژارەکان و دڵنەوایی نەدار و خاوەن پێداویستییەکان و یارمەتی بێ باوکەکان و دەست هێنان بەسەریاندا و تێرکردنی برسییەکان و یارمەتی دانی لێقەوماوەکان.

## ئینتیمای سیاسی

سەمیت سەرەتا ئینتیمای بۆ کۆمەڵەی تەبلیغ هەبوو دواتر بۆلای کۆمەڵەی برایانی موسوڵمان { الإخوان المسلمين } دواتریش بەیەکجاری لێبرا بۆ کاری خێرخوازی و یارمەتی هەژاران کەچێژی زۆری لێ دەکرد بەتایبەتی کۆمەڵگای پەراوێز خراوی ئەفریقا .

## چوونە ناو بەندیخانە

سەمیت دوو جار بەندکراوە ، جاری یەکەم لە بەغداد ساڵی 1970 کە نزیک بوو لەسێدارە بدرێت ، جاری دووەمیش ساڵی 1990 کاتێک دەزگای هەواڵگری عێراقی دەستگیریان کرد لەکاتی داگیرکردنی کوێتدا بۆماوەیەکی زۆر بێ سەروشوێن کرا و ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆری چەشتبوو بەدەستیانەوە تەنانەت گۆشتیان لەدەم و



چاو و دەست و قاچی کردبوویەوە و خۆی دەڵێت : بێگومان بووم لەوەی نامرم تا ئەو کاتەی خوای گەورە ئەجەلم دێنێ.

## لە ئەفریقا

سەمیت بەتەواوی وازی لە ژیانی خۆش گوزەرانی هێنابوو، دوای ئەوەی کە شەهادەی پزیشکی بەدەست هێنا و دەیزانی کە کاری پزیشکی چەندە سەرمایەی زۆری پێ پەیدا دەکرێت ، بەڵام ئەم ژیانی تاڵی و پر ئازاری هەڵبژارد لە پێناو بڵاو کردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی و یەکتاپەرستی لە کیشوەری ئەفریقیا کە هەژارترین کیشوەری جیهانە و لەهەموو شوێنێک زیاتر ناسەقامگیرە و ڕازی بوو بەهەموو ئەو ناڕەحەتیانەو ئەویش بەهۆی ئەو دڵە پر سۆز و میهرەبانییەی بۆ لێقەوماوانی هەبوو.

بەهۆی ئەوەوە ملیۆنەها کەس موسوڵمان بوون لە ئەمپەڕاو پەڕی ئەفریقیا ، ئەو توانی جیهانی ئیسلامی ئاگادار بکاتەوە لەو موعاناتەی کە خەڵکی کیشوەری ئەفریقیا پێیدا تێ دەپەڕێ و گەلانی موسوڵمانیش جوامێرانە هاتن بەدەم داواکەی ئەو و ئیتر ناوی سەمیت پەیوەست بوو بە ئەفریقیاوە و لێی جیا نابێتەوە ، دوای ئەوەی کە کاری تاکە کەسی گۆڕی بۆ کاری دامەزراوەیی .

سەمیت نەسڵەمییەوە بەو ئیمکاناتە کەمەی کەدەستی دەکەوت لەسەرەتادا پروای نەپراوەی بەخوای گەورە و پاشان دڵسۆزییە بێ هاوتاکەی وای لێکردبوو کە گومانی لەوەدا نەبێت کە خوای گەورە پشتگیری دەکات وسەرکەوتوو دەبێت لەپرۆژەکانی دا .

چەند جارێک ڕووبەڕووی کوشتن بووەتەوە لەلایەن میلیشیا چەکدارەکان بەهۆی زۆر ئامادەبوونی لە نێوەندی هەژاروو لێقەوماوەکاندا . هەروەکو  چەند جارێکیش دەورە دراوە لەلایەن ماری کوشندەی کۆبراوە لە مۆزەمبیق و کینیاو مەلاوی ، بەڵام خوای گەورە پاراستوویەتی.

ئێستاش سەمیت هەر بەردەوامە لە سەر کاری بانگەواز ئەگەرچی ئێستا پیربووەو قاچەکانی قورس بوون و جوڵەکانی کەم بوونەتەوە سەرەڕای توشبوونی بە چەندین نەخۆشی  وەک شەکرەو نەخۆشی گورچیلە و هتد ..

## سەرەتای کار

سەمیت پروایەکی پتەوی هەبوو بەوەی کە ئیسلام پێش هەموو بیردۆزو شارستانییەکان کەوتووە لەبواری کاری خۆبەخشی و مرۆڤایەتی . سەرەتای سووربوونی لەسەر کارکردن لە کیشوەری ئەفریقیا دەگەڕێتەوە بۆ دوای تەواو کردنی خوێندنی باڵا و گەڕانەوەی بۆ کوێت و توانایەکی خێرخوازیی بێ هاوتای هەبوو ، دەیویست بەگەڕی بخات بۆیە سەرەتا بەسەردانێک بۆ وەزارەتی ئەوقاف دەستی پێکردوو داوای لێکردن کە ئەم مەبەستیەتی

خۆ بەخشانە بەشدار بێت لە کارە خێر خوازییەکاندا ، بەڵام وەڵامەکەی بەنەرێ وەرگرتەوە و خەریک بوو ئەو حەماسەتەی کەهەیبوو بیمرێنن  !! تا خوا کردی سەفەرێکی بۆ ڕێککەوت بۆ ئەفریقیا بۆ دروست کردنی مزگەوتێک لە مەلاوی کە داراییەکەی لەلایەن خێزانی جابر ئەلئەحمەد ئەلسەباح ئەمیری کوێت دابین کرابوو ، بینی کە ملیۆنەها کەس لەسەر لێواری مردنن بەهۆی برسیەتی و هەژاری و نەزانی و نەخۆشی یەوە و تەنها ژیانیان لەسەر یارمەتی ڕێکخراوە بەگاور کەرەکانە کەسامانێکی زۆر لەبەردەستیاندایەو چەندین کەنیسەیان درووست کردووە و لەبەر برسیەتی هەزارەها منداڵیان  لە تەنزانیاو مەلاوی و مدغەشقەڕ و باشووری سودان و کینیا و نەیجەر  کردووە بە گاور و  دایک و باوکەکانیشیان بەموسوڵمانی ماونەتەوە



. موسوڵمانانیش بێ مزگەوتن و ئەوەشی کە هەیێت زۆر بچوکەو بە گەڵا و دار درووست کراوە و زۆرجاریش لەبەر برسێتی مزگەوتەکان دەبنە خۆراکی مانگاکان و خەڵکەکەشی خەڵکیکی ڕەجاڵ و بێ پۆشاک و نەشارەزا لەئاینی پیرۆزی ئیسلامن و ئەوەشی کەدەیزانن پڕە لە خەرافات و دوورە لەڕاستی و تەنانەت ئیمامەکانیشیان سورەتی فاتیحەیان تەواو و ڕەوان نیە!!  ئیتر خۆشەویستی ئەو کیشوەرە  لەنێو دڵی چەسپا و لەناخیدا جێگیر بوو و بەهاندانی هاوسەرەکەی کەداوای  لێ کردبوو کە ئێمە پێویستە خەریکی کاری خواویستی بین نەک خۆشگوزەرانی لەکەنەدا یان لەکوەیت و بۆ ئەو مەبەستەش  خێزانە دڵسۆزەکەی بڕیاری دا کە هەموو ئە ومیراتی یەی بۆی مابوویەوە بیکاتە وەقفی خێرخوازی بۆ خزمەتی هەژار و بیدەرەتانەکان و یارمەتی مێردە دڵسۆزەکەی بدات تاسەرکەوتوو بێت لەکارەکەیداو لەوێشەوە بەرەو 40 ووڵات بەڕێکەوتن بۆ بەهانا چوونی لێقەوماوەکان.

## سەلماندن

کاتێک سەمیت لە کۆتایی حەفتاکاندا دەستی بەکاری خێرخوازی کرد هەروەکو سوننەتی خوا لەم جیهانەدا  سەرەتای هەموو کارێکی چاکەکاری سەرەتاکەی پڕ لە ماندووبوون و سەغڵەتییە و دەرگاکان بەڕووەکاندا واڵانابن  ، بۆیە ئەمیش بەهەمان شێوە بۆ ماوەی 3 مانگ بەردەوام  بەشەو و بەڕۆژ لەدەرگای خەڵکی دەدا لەووڵاتێکی دەوڵەمەندی وەکوو کوێتدا  نەیتوانی زیاتر لە 1000 دۆلاری ئەمریکی کۆ بکاتەوە !! بۆیە دڵشکاوی پێوەدیار بوو بەڵام هەر بێ هیوا نەبوو و ئەمجار لەبری داواکردنی  یارمەتی لە خاوەن سامانەکان چوو بۆلای چینە مام ناوەندەکان و

بەتایبەتیش  بۆلای خوشکان کە بەو هۆیەوە هەموو دەروازەکانی خێری لێکرایەوەو توانی زۆرێک لەو کارە گرنگانە بکات بەهۆی یارمەتی ئەو خێرخوازانەوە .

سەمیت زۆرجار ماوەی 20 کاتژمێر زیاتر بە ئۆتۆمبیل ڕێی دەکرد بۆ شوێنە دوورەکان جاری واش هەبوو بەپێ دەچوو بەناو قورو لیتاودا و خۆیشی و ماڵ و خێزانەکەشی دەکەوتنە بەر ناڕەحەتی ، تەنانەت جارێکیان  بۆئەوەی بیرێک لە یەکێک لەگوندەکان لێبدات و لەبەر هیلاکی و ماندوو بوونێکی زۆر بەلای کۆمەڵێک کەسدا تێپەڕی  کە دانیشتبوون پێکەوە و لەنزیکیانەوە ویستی کەمێک پشوو بدات ، بەڵام شتێکی چاوەڕوان نەکراوی لێ بینین ، یەک یەک دەهاتن و تفیان دەکردە ناوچاوی و ڕمەکانیان هەڵدەدا بۆ بەرپێی وەکوو سوکایەتی پێکردن !! دواتر بۆی دەرکەوت کە ئەوانە مەحاکمی خێڵێک بوون و قەدەغەبووە کەس ئامادەی ئەوشوێنە ببێت ! و ئیتر نەگەڕایەوە بۆ ئەو لادێ یە.

ئەوەی کەزیاتر کاری دەکردە سەر سەمیت و دەیکردە گریان ئەوەبوو کاتێک دەچوو بۆناوچەیەک و خەڵکەکەی دەبوونە موسوڵمان و هاواریان دەکردوو دەگریان بۆ دایک و باوک و ڕۆڵەکانیان کە لەسەر بێ باوەڕی مردوون و دەیان ووت ئێوە لەکوێ بوون ئەی موسوڵمانان ؟ بۆچی ئەو هەموو ساڵە دواکەوتن؟!  بۆیە ئەو وشانە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەری و بەکوڵ دەگریا و خۆی بەبەرپرسیار دەزانی بەرانبەر بەشێک لەو خەمساردییەی باوەڕداران بەرانبەر بەوانەی لەسەر بێباوەڕی مردوون .

بۆیە سەمیت بڕیاری دابوو کە هەموو تەمەنی لەوکیشوەرەدا بخاتە خزمەتی بانگەواز بۆلای خوای گەورە ، بۆیە ئامادەبوو کە 40 کاتژمێر بە شەمەندەفەر ڕێ بکات بە چەند پارچە نانێک و لەسەردانییەکانی بەردەوام دەبوو هەروەها بەتوولە ڕێگاو بە ناو غاباتی تاریک و سامناک و بەنێو روبارەکاندا بە بەلەمی بچوک و بەنێو زەلکاوی بۆگەندا ڕێی دەکرد ، کە هەموو مەبەستی لەو سەردانانەدا تەنها ڕەزامەندیی خودا بوو و کاتێک دەگەیشتە هەرشوێنێک خەڵکەکەی کۆ دەکردەوە و



پێی دەگوتن خوای من ئەڵڵایەو تاک و تەنیایە و ئەو منی دروست کردووە و هەر ئەویش ڕۆزیم دەدات و ئەو دەممرێنی و هەر ئەویش زیندووم دەکاتەوە.

بەچەند ووشەیەکی کەم و ئاسان خەڵکانیکی زۆری پێ دێتە ناو ئیسلام ، شێوازی بانگەواز زۆر و جۆراوجۆرە و ، سەمیت لەگەڵ خۆی جل و بەرگی دەبرد بە خەڵات بۆ گەورەی دێکان بۆئەوەی دڵیان ڕابکێشێت بەرەو ئیسلام و شیرینیشی بەسەر منداڵانی دێکاندا دابەش دەکرد بۆ ئەوەی شادی بخاتە نێو دڵیانەوە. لەبەر ئەوەی سەمیت شارەزابوو بە شێوازی ژیان و عادات و تەقالیدی خێڵ و لادێ و شارەکانی ئەفریقیا سەرکەوتوبو لەکارەکانیدا و بانگخوازی سەرکەوتوو ئەوکەسەیە کە ئاشنا بێت بەسرووشتی ئەو کەسانەی دەیەوێت بانگیان بکات ، بۆیە مەرج نی یە هەموو بانگخوازێک شیاوبێت بۆ بانگەواز لە هەموو شوێنێکدا تاشارەزاییەکی تەواوی نەبێت لەسەر بەرانبەرەکانی.

سەمیت سووربوو لەسەر ئەوەی کە خۆی سەرپەرشتی دابەشکردنی ئەوداهاتانە بکات کەدەهاتە بەر دەستی و هەمووجار دەیگووت { ئەو سامانەی خێرخواکان دەیبەخشن بە هەژاران ڕێگەنادەم تەنها یەک ڕیاڵی بەهەدەر بڕوات }

بۆیە هەموو ئێوارەیەک کاتێک تاریکایی دادەهات دەگەڕا بەسەر ئەوهەتیوانەی کە کۆریان دەبەست لەدەوری مامۆستاکانیان بۆ فێربوونی قورئانی پیرۆز و لەم کۆڕ بۆ ئەو کۆڕ دەچوو بۆ ئەوەی دڵ ئارام بێت لەسەر فێربوونیان و بەزەردەخەنەوە سەیری دەکردن و شەوانە نەدەڕۆیشتەوە هەتا دەیزانی منداڵەکان هەموویان خەوتوون و گەر کەسێک پرسیاری لێ بکردایە سەبارەت بە و ماندووبوونانەی پێی دەگوتن { براکەم ئێمە چاوەڕوانی خەڵات و شەهادەی هیچ کەس ناکەین بەڵکوو ئێمە کارمان لەم گۆڕەپانەیەو تەنها چاوەڕوانی ئەوەین کە خوای گەورە لێمان وەربگرێت } .

بۆیە سەمیت کەمجار وابوو پارەبدات بە هەژاران بەڵکوو لە ڕێگای پرۆژەی بچوکەوە پێشکەشی دەکردن  وەکوو کردنەوەی دوکان و پێدانی مەکینەی دروومان و کردنەوەی حەوزی ماسی کەبەهۆیەوە خەڵکی بژێوی خۆیان پێ دەردەکردوو زۆربەی جاریش بەهۆیەوە دەهاتنە ناو ئیسلام ، هەر ئەمە وای کرد زیاتر لە 10

ملیۆن کەس موسوڵمان ببێت و دەیەها هەزار خێڵ و سەرکردەکانیان و بانگخوازانی ئایینەکانی تر بە گشتی بێنە ناو ئیسلامەوە ، ئەویش بەدابین کردنی شوێنی حەوانەوە بۆیان و دۆزینەوەی کار و کردنەوەی نەخۆشخانە و قوتابخانەو دابین کردنی پێداویستییەکانیان.
موسوڵمان بوونی ئەم ژمارە زۆرە بەهۆی ڕەوشتی بەرز و خۆشەویستی ئەو بوو بۆ هەژاران ، لەکاتێکدا هەموو ئەو ڕێکخراوە تەبشیرییانەی ڕوویان دەکردە ئەو ناوچانە خواردنیان بەکەس نەدەدا و چارەسەری نەخۆشی کەسیان نەدەکرد هەتا بەمەرجیان نەگرتایەت لەسەری دەبێت ببێت بە گاور !!
سەمیت پروای تەواوی هەبوو کەباوەڕداران گەیشتوونەتە ئەفریقیا پێش ئەوەی بگەنە مەدینەی منەوەرە، مزگەوتی وا هەیە لە دوورگەی بتی لەکینیا کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ 1320 ساڵ لەمەو بەر و لە زەنجباریش بریتانییەکان مزگەوتێکیان دۆزیوەتەوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ 1370 ساڵ لەمەو بەر کە تا ئێستاش ئاسەواری هەرماوە ، بەسەدان مزگەوتی تریش هەن لە ئەفریقیا کە مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە 1000 ساڵ لەمەو بەر.

سەمیت ئەگەرچی کارەخێرخوازی یەکانی زیاتر تایبەت بووە بە کیشوەری ئەفریقیا بەڵام دەستی خیرخوازیشی هەبووە لەگەڵ وولاتانی تری وەکو عێراق کە زانکۆی تێدا تەواو کردووە بۆیە کۆمەڵگەی یارمەتی ڕاستەوخۆ پری 2 ملیۆن دۆلاری تایبەت کرد بە هاوکاری قوتابیە هەژارەکانی عێراق و دەستگیرۆیی خانەوادە دەست کورتەکان و لەو پێناوەشدا تووشی ڕوداوێکی هاتوچۆ دەبێت لەڕێگەی شاری (کووت ) کە 160کم لەبەغداوە دوورە ئۆتۆمبیلەکەی خۆ دەکێشێت بە ئۆتۆمبیلێکی بار هەلگردا و بە وهۆیەشەوە لەچەند لایەکەوە ئێسقانەکانی دەشکێ و بۆماوەیەک لە نەخۆشخانەی کووت دەمێنێتەوەو دواتر دەگوێزرێتەوە بۆ کوێت بۆ وەرگرتنی چارەسەر و دواتریش چاک دەبێتەوە .



دکتۆر سەمیت کۆچ دەکات بەتەواوەتی بۆ مەدغەشقەر لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بۆ ئەوەی بەتەواوەتی لی ببڕێ بۆ ئەوێ بۆ بانگەواز کردنی خێڵی ئەنتیموور و سەرپەرشتی کردنی چالاکییەکانی کۆمەڵگەی هانای ڕاستەوخۆ لە ئەفریقیا .
خێڵی ئەنتیموور ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ عەرەبە حیجازییەکان و نموونەیەکن لەو عەرەبە موسوڵمانانەی کە لەئەفریقیادا لەدەس چوو بوون و خێڵی غەبرا لە باکووری کینیاو بورانا لە باشووری ئەسیوبیا و بەشێک لە سکلافییەکان لە خۆرئاوای مەدغەشقەر و فارمیەکان لە باشووری زیمبابۆی . بۆیە سەمیت بەپێوویستی دەزانی لەسەر خۆی کە هەمو هەوڵ و تواناکانی بخاتە گەڕ بۆ ڕزگار کردنی خێڵی ئەنتیموور و ڕزگاریان بکات لە و خەرافات و شیرکەی کە تیایدا دەژیان ئەگەرچی ڕێگاکەش زۆر ئاسان نەبوو.

## خێڵی ئەنتیموور

سەمیت جێنشین بوو لە ئەنتیموور و کاری زۆری بۆ کردن وەک درووست کردنی مزگەوت و سەرپەرشتی هەتیوان و هەروەها لە ڕووی بانگەوازوو زانست و ڕۆشنبیری و تەندرووستی و هەڵکەندنی بیری ئیرتیوازی و درووستکردنی قەبرستانێکی تایبەت بە موسوڵمانان کەپێشتر نەیان بوو . هەمووی لەژێر ناونیشانی بەموسوڵمان کردنی خێڵی ئەنتیموور ،

سەمیت بەتەواوەتی لێبڕابوو بۆ بانگەواز لەئەفریقیا و بڕیاری دا جێنشین بێت لەنێو خێڵی ئەنتیموور کەبەڕەچەڵەک موسوڵمان بوون و ئێستا هیچ شارەزاییەکیان لە ئیسلام نیەو بوون بە بت پەرست !! کەپێشتر لەحیجازەوە هاتبوون بۆ ئەوێ نزیکەی 800 ساڵ لەمەوبەر لە باشووری مەدغەشقەر جێنشین بوو بوون و هیچ ئاسەوارێکی ئیسلامی یان پێوە دیار نەمابوو تەنها بەحەرام زانینی بەرازو بەگلاو زانینی سەگ نەبێت !! و نوسینەکانیشیان بە پیتی عەرەبی دەنووسی بەڵام بەزمانی خۆیان و دواتر کەوتوونەتە بەرد پەرستن و مۆرکی ئیسلامیان پێوە نەمابوو .

بۆیە سەمیت بڕیاری دا لەو ناوچەیە بژی بۆ ئەوەی بتوانێت بیانگێڕێتەوە بۆلای ئاینی پیرۆزی ئیسلام ، ئەگەر چی ناوچەیەکی بێ خزمەتگوزاری و ناخۆش بوو بەڵام ئەم بۆ خۆشی نەهاتبوو !! ئەو خۆشی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە بتوانێت بەرەو ئیسلامیان بهێنێتەوە و خوا لەخۆی ڕازی بکات نەک شوێن و مەنزڵی خۆش بۆ خۆی بەدەست بهێنێت .

ژمارەی خەڵکەکەی نیو ملیۆن کەس بوون و پێویستیان بە تێکۆشانێکی زۆر هەبوو ، سامانێکی زۆریشی دەویست بەتایبەتیش کەنیسە زیاتر لە 110 ساڵە لەنێوانیاندا کاردەکات . بۆیە نەخشەیەکی بۆ دانان بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام تیایاندا کە 25 ساڵ دەخایەنێت و بڕی 50 ملیۆن ڕیاڵی سعودی تێ دەچێت ، کە ئێستا لەهەوڵی ئەوەدایە ئەو بڕە دارایی یە کۆبکاتەوە و بیکاتە وەقف بۆ ئەو موسوڵمانانەی کە دوورەپەرێزوو و لادراون لە ئاینەکەیان .

دەیەها هەزار کەس لەو خێڵە ئێستا بوونەتەوە بە موسوڵمان و خەرجی هیدایەتدانی هەریەکێکیان کە بە هۆیەوە توانراوە بگەڕێنرێتەوە بۆ لای ئاینەکەیان بڕی 312 ڕیاڵی سعودی تێچووە ،

ئەگەرچی بەداخەوە ئەمە کۆتا وولآت بوو سەمیت کاری تیا بکات !! بەهۆی چاوچنۆکی و بوغز و ڕقی ڕێکخراوە بەگاور کەرەکانەوە کەکاری ئەوانی زۆر هێنابووە دواوە ، بۆیە دەسەڵاتدارانی مەدغەشقەریان لێ پرکردوو تۆمەتی تیرۆریستییان بۆهەڵبەست و بەوهۆیەوە دووریانخستەوە لەوێ و نەیانهێشت چیتر کاری خێرخوازی بکات لەو ناوچەیەدا و ڕێگای پێگەیشتنی یارمەتییە دەرەکییەکانیشی لێ گیرا و تەنانەت نەیشیاندەهێشت جل و بەرگی خێرخوازیشیان بۆ بنێرێت !!



# خێڵەکانی تر

هەندێک لە خێڵە موسوڵمانەکان لە ڕۆژئاوای ئەفریقیا زۆر دڵخۆش بوون بەوەی دکتۆر سەمیت وەکو عەرەبێکی موسوڵمان سەردانیان دەکات ، بۆیە پۆشاکێکی پاشایانەیان پێ بەخشی و داوایان لێکرد کە بیکەن بە پاشای خۆیان بەڵام ئەم ڕەدی کردەوە و چەندین جاریش کچی خۆیان داوەتێ تا هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکات ، بەڵام ئەو هەموو ئەوانەی رەد کردۆتەوە چونکە ئەو سەرقاڵ بوو بە کارەکانی خۆی کە زۆر لەوانە گەورەتربوو کە سەرقاڵ ببێت پێیانەوە .

ساڵانە سەمیت خێڵێك یان دووان دەدۆزێتەوە کە بەڕەچەڵەک موسوڵمان بوون و بەهۆی داپڕانیان لە بانگخوازان و بەهۆی هەندێك بانگخوازی بێ حیکمەتەوە بوون بە بت پەرست !! کەلە کۆتایی ئەم ساڵانەدا خێڵی ( لەهویا ) ی دۆزیەوە کە بە دووەم گەورەترین خێڵی کینیا دەناسرێن کە پێش 140 ساڵ موسوڵمان بوون و پاشایەتییەکی ئیسلامییان بۆخۆیان دامەزراندوە بەناوی پاشایەتی مومیاسی ئیسلامی کەبەهۆی کەمتەرخەمی بانگخوازانەوە ئێستا 2% لەسەدا دوویان موسوڵمان ماونەتەوەو پێویستیان بەوە هەیە یارمەتی ماددی و مەعنەوی بدرێن بۆ ئەوەی جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ باوەشی ئاینی ئیسلامی پیرۆز .

## سەمیت لەبارەی خۆیەوە چی دەڵێت

سەمیت دەڵێت : کاتێک گۆچانی ماندوو بوون دادەنێم کەببینم بەهەشت زامن بووە بۆم کەمنیش ئەوە نازانم ! بۆیە چارێکی ترم نیە جگە لەبەردەوام بوون لەسەر ئەم بانگەوازەم چونکە پاشەڕۆژێکی سامناک چاوەڕێمانە.

هەروەها دەڵێت : چۆن دەتوانم پشووبدەم لەکاتێکدا بە ملیۆنەها کەس پێویستیان بەوە هەیە کەدەستیان بگیرێت و ئیسلامیان پێ ئاشنا بکرێت لەکاتێکدا ناحەزانی ئیسلام بەهەمو شێوەیەک لەهەوڵدان بۆ دورخستنەوەی باوەڕداران لە ئاینەکەیان؟.

ئەو کەسێک بوو دنیای لەپشت خۆیەوە دانابوو و بەردەوام لەهەنگاو نان بوو بۆ پێشەوە بۆ خزمەتی باوەڕداران لەسەرتاسەری جیهان کە ئەو گەنجێتی خۆی کردە قوربانی فەقیر و هەژار و موحتاجەکان و پەیوەست بوو پێیانەوە و لەگەڵیان دەژیا ! ناوەکەی پەیوەست بوو بە کیشوەری ئەفریقیا و زۆربەی وولاتانی ئەو کیشوەرە ئاشنابوون پێ ی و ناسرابو بە بانگخواز و پەروەردەکار وباوکی هەتیوان و هەر وەکو ئەوان دەژیا و بەردەوام لە سەغڵەتییەکانیانی کەم دەکردەوە ، کە لەو پێناوەدا تاڵی و سوێری زۆری چەشتووە کە زۆر جار خەریک بووە گیانی لەدەست بدات لەپێناو بەدەست هێنانی دڵی هەژار و لاوازەکان ئەگەر سۆزی خوایی و پاشان نزای خێری ئەوهەژارانە نەبوایە ڕزگاری نەدەبوو .

بەڕاستی سەمیت باشترین وێنەی باوەڕداری ڕاستەقینەی نیشانی ئەو کیشوەرەدا و شیاویەتی کە نازناوی باوکی ئەفریقیای لێ بنرێت بەهۆی ئەوسۆزە زۆرەی بۆ هەژارانی بەخەرج دەدا وەک بانگخواز ، وەک پزیشکێکی سەرکەوتوو ، وەک بانگخوازێکی داناو لێهاتوو ، وەک بەڕێوەبەرێکی پسپۆر بۆ پرۆژە گرنگەکانی .

لەبارەی خۆیشی یەوە دەڵێت من مرۆڤێکی ئاساییم وەک هەر مرۆڤێکی تر کە لەسەر ئەم خاکە بەپیتە خاکی موسوڵمانان ( کوێت ) بەشوێن کامەرانی و شادمانی خۆیدا دەگەڕێت و من خۆشی و کامەرانی خۆم و ماڵ و خێزان و منداڵەکانم لەوێ دەستکەوتووە بۆیە بریارمدا بگوێزمەوە بۆ ئەفریقیا و لەوێ زیاتر ئاسوودە دەبم.

ماوەیەک لەمەروبەر 10 تا 11 مانگ مامەوە لە ئەفریقیا ، پێشتر کە دەمامەوە لە3 ڕۆژ زیاتر نەدەمامەوە لە هیچ شار و وڵاتێکدا ،چونکە شێوازی کارەکەم وای



دەخواست کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر سەفەر بکەم بۆ چاودێری کردنی کارەکان و بانگخوازانمان و بەرنامەکانمان بۆ یارمەتی ئەم کۆمەڵگا هەژارە ، بۆیە ماوەیەکی زۆر نەمدەتوانی ماڵ و خێزانم ببینم هەتا کاتێک دەگەڕامەوە لایان منداڵە بچووکەکەم ڕای دەکرد لێم و نەیدەناسیمەوە!! بۆیە دواتر لە پشووی هاوویندا خێزان و منداڵەکانم لەگەڵ خۆم دەبرد بۆ ئەفریقیا بۆ ئەوەی ئاشنابن بە ژیانی هەژاران لەو کیشوەرەدا !! وە بۆ ئەوەی پەیوە ندی منیش لەگەڵ منداڵەکانم دانەپرێت ، ئیتر لە دارستانەکان و بیابانەکاندا دەخەوتن و بەرنامەی تایبەتم نەبوو بۆیان و بەرنامەی کارە خێرخوازی یەکانم بەرنامەی ئەوانیش بوو !!

## حاڵەتی تەندرووستی

سەمیت تا یستا 2 جار جەڵدەی دڵ لێی داوە و جارێکیش جەڵدەی مێشک و ماوەیەکی زۆریشە ئازاری نەخۆشی شەکرەش ناڕەحەتی کردووە کە ڕۆژانە 5 دەرزی ئەنسۆلین بەکاردەهێنێت و دووجار تووشی نەخۆشی مەلاریا بووە و ڕانی و چەند پەراسوویەکی شکاوە لەکاتی گەیاندنی یارمەتی بە هەژارانی عێراق و بوونی ئازار لە پشتی و پێیەکانی دا و ڕۆژانە 10 جۆر دەرمان بەکاردەهێنێت جگە لە نەزیفی چاو و بەرزی کۆلسترۆڵ لەخوێنیدا ، لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەردەوامە لەسەر بانگەواز و کارە خێرخوازیەکانی بۆ هیدایەتدانی خەڵکانێک کەپشت گوێ خراون لەجیهاندا . تەنانەت دەرمانەکانی خۆیشی دەدا بە نەخۆشە هەژارەکان !!

سەمیت هیچ کات جیاوازی نەدەکرد لە نێوان موسوڵمانێک و بێ باوەڕێکدا لە کارە خێرخوازیەکاندا لە سەرتاسەری کیشوەری ئەفریقیادا بۆ خزمەتی هەژاران چۆن یارمەتی موسوڵمانێکی بدایەت بەهەمان شێوەش هاوکاری هەژارە ناموسوڵمانەکانی دەکرد چونکە پێی وابوو هەموویان یەکسانن لە مرۆڤایەتیدا ، وە هیچ کات داواکاری پلەوپایە و نازناوی گەورە نەبووە ، بەڵکو هەمو ئاواتی یارمەتی

هەژاران و خزمەت کردنی برا موسوڵمانەکانی بوو لە ئەفریقیادا ، کە خوای گەورە تاقی کردبوونەوە بە نەخۆشی و برسیەتی و هەژاری .

## تانە لێدان و هێرشکردنەسەری

هەندێک لە عەلمانی و قەومی یەکان دەیان مەقالەیان لەدژی نوسیوە کە هاندەر بوون بۆ ریشە کێش کردنی کاری خێرخوازی و داخستنی ڕێکخراوە خێرخوازیەکان لە کوێتدا بەڵام بەپێچەوانەوە خەڵکی سوورتر دەبوون لەسەر بەخشین و ئەمەش سوننەتی خوایە لەهەموو کات و سەردەمێکدا کە بانگخوازان و خێرخوازان دژایەتی کراون بەڵام سەرکەوتن هەر بۆ خوا ویستانە.

تەنانەت جارێکیان لە دیدارێکی تەلەفزیۆنیدا لەگەڵ دکتۆر سەمیت کەسێکی ناحەز پەیوەندی کردبوو بە شێوەیەکی ناشیاو قسەی کردبوو ، هەر لەدوای ئەو کەسێکی خێرخواز پەیوەندی پێوەکردبوون بە تەلەفۆن و وتبوی من هەمو ڕۆژێک 1000 دۆلارتان دەدەمێ !! کە تا ئێستاش بەردەوامە.

## فیقهی واقیع

لەدانایی و حیکمەتی بانگخوازیی دکتۆر سەمیت ئەوە بوو کاتێک (سوڵتان ئیسالی ) لە نایجیریا موسوڵمان بوو نەیهێشت کەنیسەکان پروخێنێت کە وتبوی هەموویان دەروخێنم و پێی ڕاگەیاندبو کە هەستی مەسیحییەکان بریندار نەکات ، هەروەکو داوای لە زانا ئاینییەکان کردبوو کە فیقهێکی واقیعی دابنێن بۆ کەمایەتییە ئیسلامی یەکان لە ڕۆژ ئاوا و زۆر بەتووندی سەرزەنشتی ئەو بانگخوازانەی دەکرد کە سەردانی کەمایەتییە ئیسلامی یەکان دەکەن لە ئەوروپا و فەتوای توندیان بۆ



دەدەن لە دژی مەسیحییەکان . یان بڵاوکردنەوەی فیتنە لە نێوانی باوەڕداراندا بە هۆی زەقکردنەوەی هەندێک پرسی بچووک کە دەبێتە هۆی ڕق لێبوونەوە لە ئیسلام و پەکخستنی کاری بانگخوازی لە نێو خەڵکیدا.

## کوان عەرەبەکان !

لە بارەی ئامادە نەبوونی عەرەب و موسوڵمانان لەم کیشوەری ئەفریقایەدا کە خەڵکەکەی پێویستیان بە تیکۆشانێکی زۆر نییە بۆئەوەی بێنە ناو ئیسلامەوە ، دکۆر سەمیت دەڵێت خوا دەزانێت ئێمەی عەرەب زۆر کەمتەرخەمین زۆر زۆر بەرامبەر برا ئەفریقییەکانمان ، کە هەموو ئەفریقا ئامادەیە خۆی بفرۆشێت بۆ ئیسلام ئەگەر کەسێکیان دەست بکەوێت بانگەوازیان بکات بۆلای ئەم ئاینە پیرۆزە ، کە هیچ پێویستی بە زۆرکردن نییە !! بەڵکو من دەمەوێت دروشمی{وَمَن يُؤْتَ الحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْراً كَثِيراً}، {ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ والْمَوْعِظَةِ الحَسَنَةِ}.[25]» بەرزبکاتەوە.

هەروەها دەڵێت من گومانم لەوەدا نییە کە کیشوەری ئەفریقیا شایەتمان دەهێنێت لە ماوەی تەنها 2 مانگدا ئەگەر باوەڕداران لێ بیرێن بۆ بانگەواز و بەپێی ئەوەی کە لە بەرچاومان دەیبینین کۆمەڵ کۆمەڵ خەلک دێنە ناو ئیسلامەوە لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا و لەباشووری چاد و لە ئیسیوبیا و لە باکوری کینیا و چەندین شوێنی تر ئەگەر حیکمەت بەکار بهێنرێت !!

## دەوڵەمەندە عەرەبەکان

سەمیت پێی وایە تەنها زەکاتی عەرەبە دەوڵەمەنەکان بەسە بۆ دابین کردنی 250 ملیۆن موسوڵمان چونکە سامانەکانیان لەناوەوە و دەرەوەی ووڵاتەکانیان دەگاتە نزیکی 2275 ملیار دۆلار !! ئەگەر ئەو خاوەن سامانانە زەکاتەکانیان دەربکەن

دەکاتە 58،875 مليار دۆلار ، بەشی هەموو ئەو 250 مليۆن هەژارە موسوڵمانانە دەکات کە باس دەکرێت ئەو ڕێژەیە و بەشی هەر هەژارێک دەکاتە 227 دۆلار کەئەوە پرێکی گونجاوە بۆ ئەوەی هەژارێک لەو لەو وولاتە کەم دەرامەتانە کاری پێ بکات و لە بەرهەمەکەی بخوات !!!.

## بنەمای دڵسۆزی و بەزەیی لەکاری بانگەوازدا

کاتێک سەیری کارە خێرخوازییەکانی سەمیت دەکەیت ئەو جوانییە دەبینیت کە بیری پێشینەکانی ئەم ئوممەتەمان دەهێنێتەوە بەرچاو کە هاتن و ئیسلامیان بەجوانترین شێوە نیشانی ئەفریقیا و جەزیرەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دا . بانگەوازەکەی ئەم شێوازی هاوکاریی مرۆیی بێ خەوشی وەرگرتبوو کە هەڵگری سۆز و بەزەیی بوو کە بە هۆیەوە هەزاران کەسی بەلای خۆیدا ڕاکێشا .

ئەوەی جێگای سەرنجە هەندێک قەشەی مەسیحی بە تووڕەیی دەهاتن بۆلای و ئەیانگووت کەنیسە هەستی کردووە بەوەی کەئیسلام لەناوچەکاندا بڵاودەبێتەوە و بۆیە داوایان لەئێمە کردووە کە خەڵکی ئاگادار بکەینەوە لە شوێن کەوتنی ئیسلام و هەندێکیان داوایان دەکرد هەندێک کتێبی ئیسلامی یان بدرێتێ بۆئەوەی بەرپەرچی بدەنەوە و ئیسلام لەبەرچاو خەڵکی ناشیرین بکەن !! بۆیە ئەمیش پێی دەگوتن بەسەرچاو هەرکەسێکتان هاتن دوو کتێبی دەدەینێ لەبارەی ئیسلامەوە و با پروات دوای دووڕۆژ خۆی دێتەوە و موسوڵمان بوونی خۆی ڕادەگەیەنێت !! ئەگەرچی بانگخوازی مەسیحیش بێت !! .

## **هەڵوێست و ڕووداوی کاریگەر**



1- دکتۆر سەمیت لە یەکێک لە سەردانەکانی دا بۆ یەکێک لە لادێکانی ئەثیوبیا کۆمەڵێک منداڵی بینی کە بە لاشە گەورەبوون و هەندێکیان دەیان توانی پرۆن بەپێ بەڵام هەندێکی تر بەگاگۆڵکێ دەڕۆشتن کەتەمەنیان لەدەوری دە ساڵ و دوانزە ساڵان دەبوون کەزۆربەیان سێ چوار ڕۆژ بوو هیچیان نەخواردبوو بۆیە لەگەڵ خێزانی و منداڵەکانی چوونە یەکێک لە کوخەکان سەیریان کرد دایکێک و منداڵەکانی و بەشێک لە خزمەکانی لەژوورەوەن و 3 ڕۆژە هیچ شتێکیان نەخواردووە لەو سەردەمە دا لەبەر ئەوەی ساڵانی قات و قڕی بوو تەنانەت گیاش نەبوو بیخۆن !! بۆیە خێرا یەکێک لە کچەکانی چوو لە ناو سەیارەکەدا هەندێک خواردن بهێنێت بۆیان ،بەڵام دایکی منداڵە هەژارەکان ووتبوی ئێمە زۆر باشین بیدەن بەو کووخەی دراوسێمان چونکە ئێمە تەنها 3 ڕۆژە نانمان نەخواردوە بەڵام ئەوان 8 ڕۆژە هیچیان نەخواردوە !!

2- دکتۆر سەمیت لەیەکێک لە چاوپێکەوتنەکانیدا لە تەلەفزیۆنی کوێت کە دکتۆر عاید ئەلمەناع ئەنجامی دابوو دەڵێت جارێکیان چووم بۆ یەکێک لەووڵاتە ئەفریقیەکان و لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژەی کە مامەوە لەوێ سەدان کەس هاتن و موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند !! بۆیە قەشەیەکی کاثۆلیکی ئەوروپی هات بۆلام و ووتی من و باوکیشم هەرلێرە لەدایک بووین و 150 ساڵ دەبێت کەلێرە جێنشین بووین و تەنها مەبەستیشمان بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحییە و تا ئیستا توانیومانە چەند کەسێکی کەم بکەین بە مەسیحی !! بەڵام لەماوەی ئەو چەند ڕۆژە کەمەی کەئێوە لێرەن بەسەدان کەستان کرد بە موسوڵمان کە ئەمە جێگەی تێرامانی منە!! .

3- سەمیت دەڵێت لە ماوەی ئەو چارەکە سەدەیەی کە لە ئەفریقیا کارم کردوە زۆرترین شتێک کەدڵی خۆش دەکردم ئەوە بوو کاتێک دەمبینی کەسێک پەنجەی بەرز دەکردەوە و شەهادەی تەوحیدی دەهێنا .

4- لەگوندێک لە ڕۆژئاوای سوودان لەکاتی برسێتییەکەی ساڵی 1984 پرسیارم لێکردن چیتان دەوێت ؟ ووتیان منداڵەکانمان هەموویان لە برساندا مردوون و گەورەکانیش لەسەر لێواری مردنن دوای ئەوەی کە مەڕ و ماڵاتەکانمان هەموو مرن لەبرسا و کێڵگەکانیشمان هەموو ووشک بوون !! بۆیە داواتان لێدەکەین کە قەبرمان بۆ هەڵ بکەنن بۆ مردووەکانمان چونکە ئێمە لەبرساندا ناتوانین قەبر هەڵبکەنین و هەروەها کفنیشمان بۆ دابین بکەن !! سەمیت دەڵێت لەو ڕۆژگارە سەختانەدا لە ئەسیوبیا چەندین لادێم بینی نە مرۆڤ نە ئاژەڵ هیچیان نەمابوون هەموومردبوون لە برساندا !! تەنها 1 موسوڵمانیشم نەبینی یادی خوا بکات یان لەناو گۆڕ دا بوون یان مردبوون بەڵام کەس نەبوو بیانێژێت !! ئێسکەکانیان لەسەر شەقامەکان کەوتبوون کە هەموویان بەڵگە بوون لەسەر گوێنەدان و کەم تەرخەمی ئێمەی باوەڕدار بۆ ئەوان !! .

5- ڕۆژێکیان سەمیت چوو بۆ بانگەواز لە ڕێگەدا هەستی بە برسی یەتی و تینوویەتی یەکی زۆر دەکرد – نەخۆشی شەکرەشی هەبوو - هیچ ئاو و خواردنی پێ نەمابوو بۆیە ناچار بوو لەو ئاوە باراناوە بخواتەوە کە لەشوێنی تایەی ئۆتۆمۆبێلەکاندا کۆبوبویەوە !! کەپر بوو لە قوراو و لیتاو ، بەڵام کاتێک بینیبوی خەڵکانێک دەمردن لە تینوواندا لە شوێنەکانی تری ئەفریقیادا چونکە ئاوی باراناویان دەست نەدەکەوت بە هۆی ووشکە ساڵییەوە بۆیە زۆر سوپاسی خوای دەکرد لەسەر ئەو قوراوەی کەدەیخواردەوە لەکاتێکدا دەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ کوێت و لە ئاوی سازگار بخواتەوە !! بەڵام ئەوە هەڵبژاردەی خۆی بوو بەو هیوایەی لەئاوی کەوسەر بخواتەوە بەدەستی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی (صلی الله علیە و سلم) .

6- سەمیت دەڵێت ڕۆژێکیان بە ڕێگادا دەڕۆشتم ئافرەتێکم بینی منداڵێکی بە باوەشەوە بوو زۆر سەیری یاشماخەکەی سەری منی دەکرد و پێی ووتم دەتوانی ئەویاشماخەم بدەیتێ ؟ ووتم بۆچیتە ؟! ووتی دوێنێ منداڵێکم لەبرسا مرد و کفنم



کرد و ئەمڕۆش ئەم کچە بچوکەم مردوە و کفنم دەست ناکەوێت تا تێوەی بپێچم و بینێژم!!! بۆیە تکام وایە کە بمدەیتێ !

7- چیرۆکی ئەو منداڵەی کەناوی سدیق کینان بوو کاتی برسییەتیەکە بینیمان تەنها ئێسکەکەی مابوویەوە خەریک بوو دەمرد دایکی هێنای یارمەتی بدەین و ووتی دوێنێ براکەی مرد نەمتوانی هیچی بۆ پەیدا بکەم !! ئێستا ئەمیش خەریکە دەمرێت تکایە یارمەتیم بدەن !! ووتیان لەو زەرور تر هەیە !! بەڵام سەمیت سەیری کرد و دڵی غەمبار بوو بۆی ، ووتی ناوی بنوسن و خواردنی بدەنێ - تۆزێک ئارد و ئاوو کەمێک شیروو زەیت- !! ئەو وەجبەیان پێدا و هەموو جارێک وێنەکەی لە پێش چاومە کە لە ژوورەکەی مندا دایاننابوو خەریک بوو لە برسان دەمرد !! دوای 10 ساڵ پەیوەندیان پێوە کردین ووتیان ئەو منداڵەتان لە بیر دێت کە تەنها ئێسقانەکانی مابوو ، ئێستا تەمەنی 12 ساڵە و 10 جوزء قورئانی لەبەرە و فێری زوبانی عەرەبی بووە و بەردوام نوێژەکانی دەکات و تامەزرۆیە ببێتە بانگخواز !! ئەو منداڵە بەهۆی ژەمێکی 15 فلسی کوێتیەوە ڕزگاری بوو !! بۆیە چاکە ئەگەر کەمیش بێت نابێت بەکەم بزانرێت و جێگەی خۆی دەگرێت .

8- کارمەندێکی کۆمەڵەی هانای ڕاستەوخۆ (جمعیة العون المباشر ) دەڵێت: دکتۆر سەمیت کەسێکی خۆنەویست و زاهید بووە لە ژیانیدا , من کارمەندێکی سەمیت بووم لە یەکێک لە ئۆرگانە خێرخوازییەکانی ئەو لە سوودان ، جارێکیان ئاگادار کراین لە لایەن نووسینگەی سەرەکی کوێت کە دکتۆر سەمیت ئەیەوێت سەردانی نووسینگەی سوودان بکات کە لەو کاتەدا بەڕێوەبەری نوسینگەی سودان بەرەو ئەنجامدانی پەرستشی حەج بەڕێ دەکەوت بۆیە من ئەرکی پێشوازیکردن لە جەنابی دکتۆرم پێ سپێررا و ئەوەی شیاوی پێشوازی کردنی ئەو بێت ئامادەباشی بۆکرا ، بەڵام کاتێک کە تەشریفی هێنا ئەوکەسێکی زۆر سادە بوو بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی ئێمە بوو ، کەسێکی ڕووخۆش و لەوپەڕی تەوازووعدا دەردەکەوت و ئەوەی کە بۆی ئامادەکرابوو بە شێوازێکی زۆر جوان ڕەتی کردەوە و فەرمانی دا

هەموویان بدەین بە هەژار و لێقەوماوان و ساکارترین خواردن و خواردنەوە و پێخەفی بۆ خۆی داواکرد !! ئەوە یەکەم دەرس بوو لەبانگەوازدا کە فێری کردین .

9- سەمیت دەڵێت قوتابیەکانی کۆلیژی شەریعەمان کە دەچوون بۆ بانگەواز زیاتر لە 50 کیلۆمەتریان بە پێ دەبڕی تا دەگەیشتنە شوێنی مەبەست .

10- دەڵێت لە سە ردانێکمدا بۆ لادێیەک لەمەدغشقەر ناوی مەککە بوو تینووم بوو هیچ ئاوێکم دەست نەکەوت جگە لە خوادنەوەی ئاوێک کە پربوو لە پاشەڕۆی ئاژەڵەکان و لەکاتێکدا من شەکرەم هەبوو بۆیە بە دەست پیسایی یەکانم لاداو بەمشت لە ئاوەکەم خواردەوە !!

11- سەمیت دەڵێت خولێکمان کردەوە ئەو ژمارەی ویستمان تەواو بوو ئیتر کەسی ترمان وەرنەدەگرت بەڵام لەڕۆژی دووەم هەندێک کەسی تر هاتن کەبەشداری بکەن ، ووتمان ئەمە ڕۆژی دووەمە و ڕێژەکەی تەواو بووە ، دواتر زانیمان ئەمانە 18کیلۆ مەتر بەپێ هاتوون ! بۆیە بەخۆشحاڵی یەوە وەرمان گرتن و دواتر ووتم من بەلای ئێوەدا دەگەڕێمەوە وەرن بە ماشێنەکەی خۆم دەتانبەمەوە وتیان ئێمە وەکو پێباوەڕێک وابووین ئێستا پاش ئەو هەموو زانیاریە باشانەی وەرمان گرت لێتان دەتانەوێت بە ماشێن بڕۆینەوە !! ، شتی وانابێت دەبێت هەر بەپێ بڕۆینەوە و هەموو لادێکەشمان موسوڵمان بکەین !! هەرواش بوو بە پێ گەڕانەوە و هەرهەموو دانیشتوانی لادێ کەشیان موسوڵمان کردبوو

## عەلی کریسا

( سەرۆکی بەشی بانگەواز لە کۆمەڵەی هانای ڕاستەوخۆ لە ئەفریقیا )

کاتی خۆی بەمنداڵی موسوڵمان بووە کاتێک لە دەستی چەتە ڕادەکات و دەچێتە دێیەک لای

( حضرموت) ییەک دەبێت بە خزمەتکار ڕەوشتی خاوەنەکەی بەدڵ دەبێت ، ڕۆژێکیان مەولودنامەی پێغەمبەری خوا دەخوێنن (صلی الله علیه وسلم) موسوڵمانەکان جلی دشداشە لەبەر دەکەن و سروودی ( طلع البدر علینا ) دەڵێن بە یەکێکیان دەڵێت ئەو سروودەم فێر بکەن ئەویش پێ ی ئەڵێ ئەبیت بە



موسوڵمان ؟ ئەڵێت نەخێر !! چونکە باوکم بت پەرستە و وتویەتی قەت نەبیت بە موسوڵمان چونکە موسوڵمانان باوک و ڕۆڵە لەیەک دەکەن و هەیکەلێکت نیشان دەدەن ئەڵێن ئەوە باوکتە !! ، ئەڵێت ووتی پێم دشداشەیەکت ئەدەمێ ئەگەر موسوڵمان ببیت!! چونکە دشداشە زۆر گرانە لەوێ بەهەمووکەسێک ناکڕێت !! ئەڵێت دواتر بیرم کردەوە و بەگوێی باوکم نەکرد و بووم بەموسوڵمان باوکی کەزانی موسوڵمان بووە دەیبەستێتەوە بە زنجیر لەناو بازاڕ و ڕۆژانە بە قامچی لێی دەدا ئەگەر هیلاک بوایە مامەکانی بانگ دەکرد بۆ ئەوەی لێی بدەن !! پێنج ڕۆژ نانیان نەدایە !! دایکی لە نیوەی شەودا بەدزییەوە نان و ئاوی بۆ دەهێنا دواتر هەڵهات بۆ دێیەکی تر و پاشان باوکی هات بردیەوە بۆ ژێر قامچی و لێدان !! هەر ڕای کردەوە بۆجاری سێهەمیش هەر بردیەوە بۆیە ووتیان ئەم کورە چاک نابێت ئەبێت بیکوژین !! بۆیە مامەکانی بردیان بۆ دارستانێک لەوێ ووتیان ناتکوژین هەتا نەتکەینەوە بە بت پەرست !! ،سەگێکیان سەرپڕی و بە زۆر بەشێکیان لێ خستە ناو دەمی !! چونکە دەیانزانی موسوڵمان گۆشتی سەگ بە حەرام دەزانێت ! دواتر لەوێ بەجێیان هێشت و ئەویش بە ناچاری چوو بۆ دادگا بۆلای قازی لە ( مالندی ) و ئەویش بە پۆلیسدا وەڵامی نارد بۆ باوکی وپێی ووت تۆ نازانیت لەکینیادا هەموو کەس ئازادە لە هەڵبژاردنی هەردینێکدا بیەوێت ئەگەر دەست ببەیت بۆ کورەکەت بە خراپە ئەوا بەندت دەکەم و بە کورەکەشی ووت کورم لێرە مەبە و بڕۆ بۆ شوێنێکی زۆر دوور لەوێ بژی !!

ئەویش چوو بۆ ئۆغەندا کە 1500 کم دووربوو لەباوکییەوەو و چووە لای موسوڵمانان بۆ ئەوەی زیاتر لەئاینی ئیسلام تێ بگات . دواتر لەبەر ئەوەی شۆڕشێک درووست بوو دژی (عید ئەمین ) و موسوڵمانانیان دەکوشت لەوێش ڕۆشت !! ئەمجار چوو بۆ ( زائیر ) لەوێش برسێتیەکی زۆی لێ بوو هەر لەوێ کابرایەکی سوودانی بینی کاری خەڵوزی دەکرد داوای لێ کرد بیبات بۆ سوودان ئەویش دەڵێت تۆ پاسپۆرتت نییە من بەقاچاخ دەتبەم ئەتخەمە ناو کیسە خەڵوزەوە لەوانەیە بمریت !! ئەمیش دەڵێت گرنگ نی یە مردنم باشترە لەمەی ئێرە !! ئەویش بردی بۆ باشووری سوودان و دواتر چووە دواناوەندی لە ( خەرتووم )ی پایەختی ( سوودان ) بۆ خوێندن و کە تەواوی کرد گەڕایەوە بۆ باکووری ( کینیا ) .

دکتۆرعەبدولڕەحمان ئەلسەمیت سەرۆکی کۆمەڵگەی هانای ڕاستەوخۆ ئەڵێت ساڵی 1992 لە کینیا بینیم من ئەوم نەناسی بەڵام ئەو منی ناسی و ئیتر لەگەڵ ئێمە کاری دەکرد وەکو بانگخواز و دواتر کۆلیژی شەریعەی تەواو کرد .

ئێستا سەرۆکی بەشی بانگەوازە لە ڕێکخراوی کۆمەڵەی هانای ڕاستەوخۆ (جمعية العون المباشر ) لە ئەفریقیا و تائێستا 150000 سەدوو پەنجا هەزار کەس موسوڵمان بوون لەسەر دەستیدا و دایکی و باوکی و خزم و کەس وکارەکانیشی زۆربەیان موسوڵمان بوون .

http://www.youtube.com/watch?v=zxCTDabYmYc

## ئەوەی لەبارەیەوە ووتراوە

شێخ عەلی بادحدح: کاتێک دکتۆرم بینی دڵسۆزی و ڕاست گۆییم دەبینی لە دوو چاوە بچکۆلەکەیدا و کاتێک قسەی دەکرد هەستم بە تەوازوع دەکرد تیایدا ، ئەو پیاوێک بوو باسی لە وەدەستهێنانی زۆر گەورە دەکرد بە چەند ووشەیەکی سووک و ئاسان !!

شێخ مەشاری عەفاسی : خەڵکی مەدینەی منەوەرە دەپاڕێنەوە بۆ ئەمیری سەخاوەت و بەخشین و شێخی مرۆڤایەتی دکتۆر عەبدولرەحمانی سەمیت خوا بیپارێزێت و شیفای بدات و پۆشاکی تەندرووستی بکات بەبەریدا .

شێخ عەبدولعەزیز ئەلعەوید : لە وەدەست هێنانەکانی دکتۆر سەمیت کە ماشاءالله چەند زۆرن گۆرینی کاری تاکە بۆ کاری دامەزراوەیی کە بە کەسێکەوە پەیوەست نەبێت.

نووسەر فوئاد ئەلهاشم : لە خزمەتی دکتۆر سەمیت دا بووم لە ئەفریقیا و بە چاوی خۆم ئەو دەستکەوتانەی ئەوم بینی کە بەحکومەتی کوێت ئەنجام نادرێت لەسەر خاکی خۆیدا کە ئەم بە تەنیا ئەنجامی داوە !! لە دروست کردنی



نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستی و خوێندنگا و هەڵکەندنی بیری ئاو و چەندین کاری گرنگیتر.

## گرنگترین دەستکەوتەکانی لەساڵی 1981 – 2009

1- لەسەر دەستیدا زیاتر لە 11 ملیۆن کەس موسوڵمان بووە لە ئەفریقیا دوای ئەوەی کە 29 ساڵ بانگەوازی ئیسلامی بڵاو کردەوە لە و کیشوەرە دا.

2- دامەزراندنی کۆمەڵەی یارمەتی ڕاستەوخۆ { مسلمي أفريقيا سابقا }

4- دروستکردنی نزیکەی 5500 مزگەوت .

5- دروستکردنی 204 بنکەی ئیسلامی .

6- لە چاپ دانی 7 ملیۆن نوسخە لە قورئانی پیرۆز بە زوبانی عەرەبی و ئەفریقی و دابەش کردنی بەسەر تازە موسوڵمان بووەکاندا.

7- بە گەڕخستنی دە ئێستگە و پەخشی ڕادیۆ لە ئەفریقیا .

8- کەفالەتی زیاتر لە 50000 پەنجا هەزار هەتیو کە بەشێکی زۆریان بوون بە پزیشک و ئەندازیار و مافناس و سەفیر و دەسەڵاتی بەرزیان بە دەستەوەیە لە وولاتەکانی خۆیاندا کە پێشتر لە بنکە ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵەی هانای ڕاستەوخۆدا دەژیان .

9- دروست کردنی 840 پێکهاتەی فێرخوازی هەر لە باخچەی ساوایانەوە تا زانکۆ کە زیاتر لەنیو ملیۆن قوتابی کوڕو کچی تێدایە .

10- بە ئەنجام گەیاندنی پرۆژەی ڕۆژو شکاندن کە زیاتر لە 2 ملیۆن ڕۆژوان لەخۆ دەگرێت لە 40 وولاتدا .

11- بەخشینی ڕسوماتی خوێندن بە نزیکەی 150000 سەدووپەنجا هەزار قوتابی نەدار.

12- کەفالەتی 3000 سێ هەزار قوتابی زانکۆ.

13- پێشکەشکردنی 700 مینحەی خوێندنی باڵا .

14- وەرگێڕان و لەچاپدانی 9 ملیۆن پەرتووک بە 22 زمان .

15- هەڵکەندنی زیاتر لە 12000 دوانزە هەزار بیری ئاسایی و بیری ئیرتیوازی بۆ ناوچە هەژارەکان .

16- ئەنجام دانی 150 خێوەتگەی پزیشکی تایبەتمەند بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی چاو .

17- دروست کردنی 90 نەخۆشخانە و بنکەی تەندروستی .

18- کەفالەتی 2000 مامۆستا .

19- کردنەوەی 750 خول بۆ مامۆستایان و ئیمامی مزگەوتەکان و سەرۆکی لادێکان .

20- بە ئەنجام گەیاندنی 3 بەربەستی ئاو ( السد ) لە ناوچە ووشکەکاندا .

21- ناردنی 500 هەزار تەن خواردەمەنی و داودەرمان و جلوبەرگ .

22- تا ئێستا 150 ملیۆن دیناری کوێتی سەرف کراوە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی سەرجەم پرۆژەکان.

## بڵاوکراوەکانی

- كتاب لبيك أفريقيا.
- كتاب دمعة أفريقيا مع آخرين.
- كتاب رحلة خير في أفريقيا رسالة إلى ولدي.
- كتاب قبائل الأنتيمور في مدغشقر.
- كتاب ملامح من التنصير .
- إدارة الأزمات للعاملين في المنظمات الإسلامية (تحت الطبع) .
- السلامة والإخلاء في مناطق النزاعات.
- كتاب قبائل البوران.
- قبائل الدينكا.
- دليل إدارة مراكز الإغاثة.



## ئەوخەڵاتانەی تائێستا وەری گرتووە

سەمیت ژمارەیەکی زۆر خەڵات و شەهادەی ڕێزلێنانی وەرگرتووە بە هۆی کارە خێرخوازییەکانیەوە کەلەسەروی هەمویانەوە خەڵاتی جیهانی مەلیک فەیسەڵی پاشای سعودی بوو بۆ خزمەتکارانی ئیسلام لەساڵی 1996 کە بەو هۆیەوە پری 750 هەزار ڕیاڵی سعودی پێ بەخشرا بۆ ئەوەی ببێتە پاڵپشتێک بۆ وەقفی فێرخوازی بۆ ڕۆڵەکانی ئەفریقیا کە بەو هۆیەوە ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆڵەکانی ئەفریقا سوودمەند بوون لێ ی لە چەندین زانکۆی جیاوازدا و چەندین خەڵاتی تری وەک :

- وسام فارس العمل الخيري من إمارة الشارقة عام 2010 .
- وسام فارس من رئيس جمهورية بنين ـ 2004 .
- جائزة العمل الخيري من مؤسسة
- جائزة الشارقة للعمل التطوعي

قطر – دار الإنماء عام 2010.

- جائزة العمل الخيرى والإنساني من محمد بن راشد آل مكتوم حاكم.
- شهادة تقديرية من مجلس المنظمات التطوعية في جمهورية مصر العربية.
- جائزة حمدان بن راشد آل مكتوم للعلوم الطبية والإنسانية دبي ديسمبر 2006.
- الدكتوراه الفخرية من جامعة أم درمان بالسودان في مارس 2003 .

والإنساني عام 2009 .

- جائزة الشيخ راشد النعيمي حاكم إمارة عجمان عام 2001.
- وسام النيلين من الدرجة الأولى من جمهورية السودان عام 1999.
- وسام مجلس التعاون الخليجي لخدمة الحركة الكشفية عام 1999.
- وسام رؤساء دول مجلس التعاون الخليجي عن العمل الخيري عام 1986.

# سەرچاوەكان


1. لقاء مع حرم الدكتور عبد الرحمن السميط أم صهيب, إعداد إيمان العقيل
2. موقع إسلام أون لاين مقال عبد الرحمن السميط خادم فقراء إفريقيا. بقلم رجب الدمنهوري
3. موقع جريدة الأنباء احتفال نظمه مركز إشراق للفتيات بحضور رئيس مجلس الأمة وشخصيات العمل الخيري, إعداد ليلى الشافعي.
4. موقع إم بي سي برنامج تطوير X تغيير، البرنامج من تقديم د.عبد العزيز الأحمد(الحلقة الثانية).
5. عبد الرحمن السميط. مساعدة الفقراء ونشر الإسلام،برنامج زيارة خاصة، قناة الجزيرة، 2007





6. خادم فقراء أفريقيا بقلم إبراهيم أديب العوضي.
7. موقع إسلام أون لاين مقال خادم فقراء إفريقيا. (المصدر السابق) قسم حياة حافلة بالإنجازات.
8. موقع إسلام أون لاين مقال خادم فقراء إفريقيا (المصدر السابق) قسم الخير في قارة تحتاج إليه وقسم قصة دخوله إفريقيا.
9. موقع صيد الفوئد مقال عندما زرتك يا دكتور, بقلم فهد بن عبد العزيز السنيدي.
10. عبد الرحمن حمود السميط، فوق نوبل! بقلم نجيب الزامل.
11. موقع طريق الإسلام مقال عبد الرحمن السميط نجم في سماء الواقع المر بقلم أبوالهيثم محمد درويش.
12. رجل من زمن الصحابة موقع صوت الحق, بقلم شيرين الالفي.
13. موقع صحيفة اليوم مقال السميط أسطورة الإغاثة الخيليجية، بقلم مهنا الحبيل.
14. "عبد الرحمن السميط".. رجل بأمة إعداد مجلة البيان.
15. موقع الوتد لنشر المعلومات حول التعليم والدعوة.
16. رجل بأمة لقاء مع أمل عبد الله القضيبي.
17. موقع جعية العون المباشر البطاقة الشخصية للدكتور عبد الرحمن السميط.
18. خادم فقراء إفريقيا. قسم مولده ونشأته.
19. الغمندة عبد الرحمن السميط مزيد مبارك المعوشرجي, صحيفة القبس الكويتية.
20. شافاك الله يا الدكتور السميط حمد سالم المري, جريدة الوطن الكويتية.
21. طريق الحقيقة همة رجل ونضال عمر.
22. الرجل الذي غير القارة: عبد الرحمن حمود السميط صعيدي في قوقل, 14 يناير 2010.
23. موقع صحيفة الرياض مقال رجل يعرف كيف يدعو للإسلام, بقلم عبد الواحد خالد الحميد.
24. عبد الرحمن السميط سيرة ومسيرة بقلم جاسم بودي.
25. د. عبد الرحمن السميط: لا شيء يمنع إفريقيا من الإسلام!
26. موقع عيال الكويت فقرة هجرته إلى مدغشقر. (نقلاً عنه).

27. مفكرة الدعاة لقاء مع الداعية د.عبد الرحمن السميط.(2010/6/20)
28. أراء وأفكار الدكتور عبد الرحمن السميط.تاريخ العمل الإنساني المشرف, جمال بن حويرب المهيري.
29. موقع جمعية العون المباشر.
30. الطبيب والداعية والأب : الشيخ :عبد الرحمن السميط بقلم فؤاد علي بكر علي.
31. خادم فقراء أفريقيا الدعوة من خلال التنمية بقلم أمل خيري.
32. عبد الرحمن السميط الطبيب الذي نشر الإسلام في القارة السمراء عبد العزيز بكر, وجوه وأعلام, موقع لها أون لاين.
33. عبد الرحمن السميط.. والأمانة الثقيلة فارس عبد الرحمن الفارس, جريدة الوطن الكويتية.
34. عبد الرحمن السميط أنموذج العمل التطوعي بقلم منى يوسف حمدان.
35. قصص مؤثرة واقعية يرويها فضيلة الدكتور عبد الرحمن السميط من صيد الفوائد.
36. صفحته على موقع طريق الإسلام.
37. خادم فقراء أفريقيا بقلم نورة خالد السعد.
38. رجل يعرف كيف يدعو للإسلام بقلم عبد الواحد خالد الحميد.
39. موقع لبيك أفريقيا.
40. الشيخ عبد الرحمن السميط يصل الكويت بعد رحلة علاج استمرت 8 أشهر بقلم صالح الجمعة.
41. عبد الرحمن السميط.. أسطورة تتكلم عصام عبد اللطيف الفليج, جريدة الوطن الكويتية.
42. بين السميط والسبع... سفارة عبد الرزاق إبراهيم الفيلكاوي, جريدة الراي.
43. خطاب شكر من د.السميط إلى العلمانيين والليبراليين مجلة الكوثر.
44. بوشهري تقترح إطلاق اسم الداعية عبد الرحمن السميط على أحد الشوارع بقلم بداح العنزي.
45. شخصيات إيجابية عبد الرحمن بن حمود السميط – خادم الدعوة في أفريقيا




## يو تيوب


1- https://www.youtube.com/watch?v=UdpLzDb1Jbk
2- https://www.youtube.com/watch?v=PLJ4kR-G-zA
3- https://www.youtube.com/watch?v=AMUi62MblYo
4- https://www.youtube.com/watch?v=Ob8I-2vr7Ow







**وێنەی بانگخواز**

**(عبدالرحمن السميط)**

# فەهرەست